بابەتێکی پوخت لەبارەی

# چۆنیەتی عومرە کردن

نوسینی:
شێخ عبدالعزیز بن عبدالله بن باز
(رحمە الله)

وەرگێڕانی:
دیاری حمە صدیق

(لاالە الا اللە، واللە أکبر، لاإلە إلا اللە وحدە لاشریك لە، لە الملك ولە الحمد وهو علی کل شيء قدیر. لاإلە إلااللە وحدە،أنجز وعدە،ونصر عبدە، وهزم الأحزاب وحدە)

پاشان دوعادەکات بەوەی بۆی ئاسانە، دەست بەرز دەکاتەوە، ئەم زیکر و دوعایە (٣ جار) دەڵێت.

پاشان دەچێت بۆ (مەڕوە) هەتا لای ئیشارەتە سەوزەکە دەڕوات لە ئیشارەتە سەوزەکەی یەکەم پیاو کەمێك بەخێرایی دەڕوات تاکو دەگاتە ئیشارەتە سەوزەکەی دووەم. بەڵام ئافرەت شەرعی نیە بەخێرای بڕوات، لەبەر ئەوەی ئافرەت عەورەتە(لاشەی سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێت)پاشان سەر دەکەوێت بۆ سەرکێوی (مەڕوە) یان لەنزیکی دەوەستێت، سەرکەوتنەکە باشترە، ئەوە لەسەر کێوی (مەڕوە) دەکات کە لەسەر کێوی(سەفا) کردویەتی ،بەڵام ئایەتی (ربنا آتنا....) ناخوێنێت .

خوێندنی ئەو ئایەتە تەنها لەیەکەم جارە کەسەر دەکەوێت بۆ سەر کێوی سەفا،ئەوە لەشوێن کەوتنی پێغەمبەرە ﷺ

پاشان دادەبەزێت لە مەڕوە بۆ سەفا، حەوت جار ئەمە دەکات ڕۆیشتنی جارێکە و هاتنەوەی جارێکە. ئەگەر خێرا بڕوات ئاساییە بەتایبەت لەکاتی پێویستی. سونەتە دوعا و زیکر زۆر بکات لەکاتی (سەعی) یەکەیدا .

ئەوەی ئاسانە بۆی، وە پاك بێت و دەست نوێژی هەبێت ئەگەر دەست نوێژیشی نەبێت ئاساییە .



## سەرتاشین یان کورت کردنەوەی

٨- ئەگەر (سەعیەکە) ی تەواو کرد پیاو سەر دەتاشێت یان کورتی دەکاتەوە ، تاشین خێرترو باشترە .

وە ئەگەر گەیشتنی بە مەکە نزیك بوو لەکاتی حەج،کورت کردنەوەی باشترە، بۆ ئەوەی لەکاتی حەجدا سەری بتاشێت .

بەڵام ئافرەت قژی کۆدەکاتەوەو بەئەندازەی سەری پەنجەی لێ دەبڕێت (نابێت نامەحرەم ئەو قژبڕینە ببینێت)، ئەگەر ئەم کارانەی تەواو کرد ئەوە عومرەکەی تەواو کردووە -سوپاس بۆ خوای گەورە-وەهەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە کەپێشتر بەهۆی ئیحرامەوە لێی حەرام بوو .

وصلی الله وسلم علی عبده ورسوله نبینا محمد ، وعلی آله وأصحابه وأتباعه بإحسان إلی یوم الدین .

نوسینی:
شێخ عبدالعزیز بن عبدالله بن باز
(رحمە الله)

## ئیحرام بەستن (وتنی لبيك عمرة)

١- ئەگەر کەسێك بچێت بۆ عومرەکردن کە گەیشتە(الميقات) سوننەتە خۆی بشوات و خۆی پاك بکاتەوە، ئافرەتیش بەهەمان شێوە(ئەگەر لەسووڕی مانگانە یان خوێنی دوای منداڵ بوونیش بێت) بەڵام ئافرەتان لەو دوحاڵەتەدا تەواف ناکەن هەتا پاك دەبنەوە و خۆیان دەشۆن. وە پیاوان خۆیان بۆن خۆش دەکەن نابێت بۆن بەر پۆشاکی ئیحرامەکەیان بکەوێت.
ئەگەر بۆی ئاسان نەبوو لە (الميقات) خۆی بشوات ئاساییە، بەڵام سوننەتە کە گەیشتە مەککە پێش ئەوەی تەواف بکات خۆی بشوات ، ئەگەر بۆی ئاسان بوو .

٢- ئەو پۆشاکانە لەبەرت لادەدەیت کە درومانی تێدایە، وە دوو پارچە قوماشە سپیەکە لەبەر دەکەیت (بەشی سەرەوە و خوارەوە) کە پێی دەوترێت( إزار و رداء) وە سوننەتە ئەو دوو پارچە پۆشاکە سپی و پاك بن، دەبێت سەری ڕوت بێت(هیچی بەسەرەوە نەبێت)، وە ئافرەت تەنها پۆشاکە ئاساییەکەی خۆی لەبەر بێت.

٣- پاشان بەدڵ نیەت دەهێنیت وە بەزمان دەڵێت(**لبيك عمرة**) یان(**اللهم لبيك عمرة**)، ئەگەر ترسا لەوەی کە عومرەکەی بۆ ناکرێت بەهۆی(نەخۆشی یان ترسان لە دوژمن یان هەرشتێکی تر، لەکاتی نیەت هێنان دەڵێت ئەگەر ڕێگر هەبوو لەوەی عومرەکەم تەواو بکەم ئەوا نیەتەکەم تاکو ئەو شوێنەیە.
پاشان دەست دەکات بە تەلبیە کردن، وەك شێوازی پێغەمبەر 



دەڵێت:(**لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك إن الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك**) وە زۆر دوبارەی دەکاتەوە وە زیکر و دوعای زۆر دەکات، کە گەیشتە( المسجد الحرام) قاچی ڕاستی پێش دەخات و دەڵێت(**بسم الله، والصلاة والسلام على رسول الله،أعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم، اللهم افتح لي أبواب رحمتك**) وەك هەموو مزگەوتەکانی تر، پاشان تەلبیە دەکات هەتا دەگاتە کەعبە .

## تەواف کردن

٤- کە گەیشتە (کەعبە) تەلبیە ناکات،کە گەیشتیتە بەردە ڕەشەکە ماچی دەکەیت
بەدەستی ڕاستی سەلامی لێ دەکەیت وە ماچی دەکەیت ئەگەر بۆت ئاسان بوو، وە خەڵکی ئازار نادەیت و لەکاتی سەلامکردن دەڵێت(**بسم الله والله أكبر**)، یان دەڵێت (**الله أكبر**)
وە مەرجە بۆ تەواف کردن پاك و خاوێن بیت(دەست نوێژت هەبێت) لەبەر ئەوەی تەواف کردن وەك نوێژە جگە لەوەی قسە کردنی تێدایە .

٥- بەیت دەکاتە لای چەپیەوە، وە حەوت جار تەواف دەکات، کە گەیشتە لای(الركن اليماني) تەنها دەستی لێ دەدەیت و ماچی ناکەیت، وە دەڵێت (**بسم الله والله أكبر**) وە سوننەتە(الرمل) _ واتە کەمێك ڕۆیشتن بە خێرایی و هەنگاوی نزیك لە سێ تەوافی یەکەمدا(تایبەتە بە پیاوان) وە سوننەتەبۆ پیاو لەتەوافەکانی سەرەتادا (الإضطباع) بکات واتە لای ڕاستی (الرداء) کەی بخاتە ژێر باڵی ڕاستیەوە سوننەتە



زۆر زیکر و دوعابکات لەهەموو تەوافەکاندا وە لەکاتی تەوافدا دوعاو زیکری تایبەت نی یە، بەڵکو دوعا و زیکر دەکات ئەوەی بۆی ئاسانە، وەلەنێوان دووڕووکنەکەدا ئەم زیکرە دەخوێنێت(**رَبَّنَآ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ**) لەهەموو تەوافەکاندا چونکە لە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- واهاتووە .

٦- پاشان دوو ڕکات نوێژ دەکات لەپشت مەقامی ئیبراهیمەوە ئەگەر بۆی ئاسان بوو ئەگەر بۆی ئاسان نەبوو ، لەهەر شوێنێکی مزگەوتدا بێت نوێژەکە دەکات ، لەدوای سورەتی -**الفاتحة**- (**قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ**) دەخوێنێت لەڕکاتی یەکەمدا، وە(**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ**) دەخوێنێت لەڕکاتی دووەمدا ، ئەوە خێرترو باشترە، ئەگەر جگەلەوەیش بخوێنێت ئاساییە. پاش تەواو بونی نوێژەکەی دەچێت دەستی ڕاستی دەدات لەبەردە ڕەشەکە ئەگەر بۆی ئاسان بوو .

## سەعی (سەفا و مەڕوە)

٧- پاشان دەچێت بۆ سەر کێوی سەفا(دەچێتە سەر شاخەکەیان لەنزیکی دەوەستێت چونە سەر شاخەکە باشترە وە لەسەرەتای دەست پێکردنیدا ئەم زیکرە دەڵێت(**إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ**) وە سوننەتە لەسەر کێوی(سەفا) ڕوو بکاتە قیبلەو، سوپاسی خودا بکات و(**الله أكبر**) بکات، وە ئەم زیکرە بڵێت